زنجیرەی :

## با چاکتر ئیسلام بناسین !

ئاڵقەی یەکەم




# خودا

سبحانه وتعالى

نووسینی : علی باپیر

١٤٠٨ ك - ١٩٨٨

# پێشکەش بێ

**************

بەو بڕواداڕانەی کە وەك قورئان و سوننەت دەڵێن بڕوایان بە خودا هەیەو دڵیان پڕپڕە لە شەرمو خۆشەویستی و ڕێزو حورمەت و سامو هەیبەتی وە دایموودەرەم سەرگەرمی پەرستن و بە پاك گرتن و سوپاس كردن و بە گەورەگرتننی •

پێشەکی ئەم زنجیرەیە

الحمد لله والصلاه والسلام على محمد رسول الله واله وصحبه ومن والاه .

ئەی مسولمانی خوشەویست و بەڕێز :

شتێکی ئاشکرا و بەڵگە نەویستە کە لە سۆنگەی دوورکەوتنەوەو دوورکەوتاندنەوەمانەوە لە ڕاستەڕێ ی خوای بەرزو مەزن ، زوربەی هەرەزوری ئوممەتی ئیسلام یان هەر بەجارێك زوربەی ڕاستی یەکانی ئیسلامی لەبیر چوتەوەو زەینی لە وشەو زاراوە ڕەسەنەکانی ئیسلام کوێر بوتەوە ، یان تەم و مژو توزو گەردی پروپاگەندەی ناحەزانی شەیتان دۆستی طاغووت پەرست بەرچاوی گرتووەو بەعاستەم تارمایی یەکی دزێوو شێوێنراو لەبەرنامەی خودا بەدی دەکات .

ئنجا گومانیش لەوەدا نیە کە ئەندازەی پابەندی ی هەر گەل و کۆمەڵێك پەیوەندی یەکی ڕاستەوانە ( طردی ) ی هەیە لەگەڵ ئەندازەی حاڵی بوون و تێگەیشتنی لەو بەرنامەو پەیڕەوەی کە خوی بە شوێنکەوتووی و هەڵگری ئالایەکەی دەزانێ ، بەڵی مرۆڤی مسوڵمان چ جۆرە تێگەیشتنێکی هەبێ دەربارەی ئایین و بەرنامەکەی ، حەتمەن هەر ئەو جورە مسوڵمانەتی لێ دەرەخسێ ، جا تەواوبێ تەواوو ناتەواویش بێ ناتەواو ، چونکە ماقووڵ نیە ئینسان شارەزای ڕێ یەك نەبێ و بشتوانی پێ ی دا بڕوات !!

جا نەتەوەی کوردیشمان کە یەکێکە لە چەندان نەتەوەو بە هەموویان ئوممەتی

ئیسلام پێك دێنن، وەك هەموو گەلانی دیکەو بگرە لە زوربەشیان خراپتر، زۆر لەمێژە

دووچاری دەردی ئیسلام لەبیرچوونەوەو زەین کوێربوونەوە بووەو ئەوەی گەلی کورد

بەناوی ئیسلامەوە بەرێوەی دەبات لەگەڵ ئەو ئیسلامەی خوا بۆ پێغەمبەری صلی

الله علیه وسلم ناردووە زۆر لێك جوودان و. دەتوانین بڵێین ئێمە بەس بەشێکی

گچکەی ئیسلام بەرێوە دەبەین، ئەویش بەشێوەیەکی بێ رووح و بێ نێوەرۆك.

جا ئەی ( برا - خوشك ) ی مسوڵمانی تێگەیشتوو و بیر رووناك و دڵ گەرمو بە

جەرگ !

وەرە با هەموومان ویکرا پاڵ وێك بدەین و شان لێك بدەین، لەپێناوی حاڵی کردن و..

ئاشنا کردنی خۆمان و خەڵکی لە ئایین و بەرنامەی خودا: بەئومێدی ئەوەی کە

بتوانین خۆمان و گەلەکەمان بکەینە شوێن کەوتوویکی راستەقینەی ئەم ئاینە بەرزو

پیرۆزو بەهێزو پیزە، بەشکم خوای میهرەبان بە مسولمانی رەسەن و راستەقینەمان

لەقەڵەم بداو، بە رەزامەندی خۆی و دیداری پێغەمبەرو صلی الله علیه وسلم

برادەرانی و بەهەشتی بەرینمان شاد بکات.

هەڵبەتە گەلی کوردیش و هەر گەل و نەتەوەیەکی دیکەش ئەگەر بیەوێ لەژێر نیزی

ستەمو زۆر بێتە دەرێ و هەوای ئازادی هەڵمژێ و ببێتە خاوەنی چارەنووسی خۆی و لەژێر سێبەری درەختی دادگەری دا بژیەت، بەس یەك تاقە رێگای رزگاری لەپێشەو تەنیا یەك پزیشك و حەكیمی لەفریا دێ.ئەویش بەرنامە راست و تەواو و تەجرووبەكراوەكەی خودایە .

جا ( برا ـ خوشك ) ی مسوڵمانی سەنگین ! ئەم نووسراوەی بەردەستت شەقاوێكە ‌ژبرینی رێ ی ئامانجی ناوبراو، بەڵێ ئەم نووسراوە زنجیرەیەكە كە بە پشتیوانی خودا تەرخان كراوە بۆ روون كردنەوەی چەمك و واتای ئەو وشەو زاراوانەی كە بە بنەرەتی و بنچینەیی دادەنرێن لە بەرنامەی خودا دا، چونكە وەك گوتمان دوژمن و ناحەزانی رێ ی خودا ئەوەندی پێ یان كرابێ درێغی یان نەكردووە لە گۆڕین و شێواندن و دزێو كردنی ئەو وشەو زاراوە سەرەكی و بنەڕەتی یانەدا، بە مەبەستی دوور خستنەوەو لادانمان لە ئیسلام .

لە خوای میهرەبان و بالادەستیش داواكارم ئەم هەنگاوە هەنگاوێكی پڕ پیت و بەرەكەت و سەر بەخێر بێ و سەرەتای هەنگاو گەلێكی دیكەی بە ئەنجام گەیەنەر بێ و هێندە دڵسۆزی و ڕەزامەندی خودای تێدا ڕەچاو كرابێ،كە شایستەی ئەوە بێ لە دڵی خوشك و برایانی بڕوادار دا جێگیر بێ و بچەسپێ .

داواشم لە خوشك و برایانی مسوڵمان ئەوەیە، کە هەرچی لەم زنجیرەیەیان .... وەرگرت و بە دڵیانەوە نووسا بیگەیەنن بە مسوڵمانانی دیکە، وە هەر شتێکیشیان بە دڵ نەبوو و لێی کەوتنە گومانەوە یان ڕەخنەیان لێی هەبوو، بەرلەوەی حوکمی یەکجاری بەسەردا بدەن بەندەی پێ ئاگادار بکەنەوە .

خوداش پشت و پەنا و یاریدەدەری هەموان بێ .

گەلووی ماخۆبزنان

١٤٠٦ کۆچی

خوێنەری خۆشەویستم !

وەك لە پێشەکی ئەم زنجیرەیەدا گوتمان لە ئەنجامی دوورکەوتنەوەو دوورکەوتاندنە ـ وەمانەوە لە ئیسلام، زوربەی هەرەزۆری گەلەکەمان وشەو زاراوە بنەڕەتی یەکانـــی ئیسلامی لەبیر چوتەوەو زەینی لێیان کوێر بۆتەوە، جا گومانی تێدا نیە کــــــە گرنگترین و سەرەکی ترین و بنەڕەتی ترین وشە لە ئیسلامدا، وشەی ( خودا ) یە .

وە ئەم وشە بەرزو پیرۆزە پشکێکی چاکی هەبوە لە گۆڕان و شێوێنران دا . وە هەر وەك چۆن تۆزو خۆڵ ڕووی ئاوێنەیەکی سپی و ساف لێڵ و چڵکن دەکا، بیرو بۆچوونی پڕوپووچ و ئەفسانەیی ڕووی گەش و درەوشاوەی ئەم وشە بەرزو پیرۆزەی شێواندووەو .. لەبەر چاوی گەلێك کەسی بێزاندوە .

جا ئێمە خوا پشتیوان بێ بە ئومێدی ڕوون کردنەوەی حەقیقەت و نیوەڕۆکی ئەم وشەیەو تۆزو گەرد لێ تەکاندنی و ڕەواندنەوەی تەمو مژی ئەو بیرو بۆچوونە تێڕوانینە ئەفسانەیی یە بەناو ئیسلامی یەی دەوری داوەو لێی هالاوە، لەم ئالقەیەدا لە (11) .. خالّ دا بیرو بۆچوون و تێڕوانینی مرۆڤی مسولمان لەوبارەوە دەخەینەڕوو. تا قسە ماموّستا و ڕێڕوونی کەریشمان لە نووسینی ئەم باسەو باسەکانی دیکەی ئـــــەم زنجیرەیەدا قورئانی بەهێزو سوننەتی بەپێزی پێغەمبەری بەڕێزە صلى الله عليه وسلم.

## ١ـ خوا بەدیهێنەرو پەروەردگــــــــــارە
******************************************

مرۆڤی مسولمان بڕوای وایە کە ئەم بوونەوەرەو هەرچی تێیدایە پەرێزو شوێنەواری خوا یەکی بەدیهێنەرو(١) پەروەردگارە(٢)، کە لە ئەنجامی سۆزو بەزەیی و چاکەکاری خۆیەوە هێناویەتە دی، بە پێچەوانەی باوای ماددەپەرستو بێ باوەڕەوە کە پێ ی وایــــــە(٣)

---

(١) ( اللە خالق كل شی ) الزمر/ ٦٢ • خودا بەدیهێنەری هەموو شتێکە •

(٢) ( قل أغیر اللە ابغی ربا وهو رب كل شی ) الانعام/ ٦٠ • بلێ : ئایا جگە لە خوا پەروەردگارێکی دی بخوازم کە ئەو پەروەردگاری هەموو شتێکە ؟

(٣) ( الرحمن الرحیم ) الفاتحە/ ٣ • بەبەزەیی بەخشندەیە •

( ورحمتی وسعت كل شی ) الاعراف/ ١٥٦ • بەزەیی من هەموو شتێکی گرتۆتەوە •

تێ بینی یەکی گرنگ :

ئەم ڕستەیە ( کە لە ئەنجامی سۆزو بەزەیی و چاکەکاری خۆیەوە هێناویەتەدی •) وەلامێکی بەهێزو ددان شکێنی تێدایە، بۆ پرسیارێك کە دلّی هەندێك لات و پات وگەجەرو گوجەری بێ بڕواو خوا نەناس ـ یان خۆ بە خوانەناس پیشاندەرـ ی کرمێ و گوماندار کردوە !

پرسیارەکەش ئەمەیە : بێگومان ئێوە دەلێن خوا حەوجێ ی غەیری خۆی نیە، چونکە خوا خاوەنی هەموو سیفەتێکی بەرزو پەسندەو ـ لە هەموو سیفەتێکی نزم و کـــــەم و

کووری یەك دوورە، باشە ئەدی مادام خوا پێویستی بە بوونەوەر نیە بۆچی خوڵقاندوویەتی ؟!
حەتمەن ئێوەی خوانەناس ناچارن لەدوو شتی خراپ یەکیان هەڵبژێرن، یان دەبێ بڵێن :
خوا حەوجێی بوونەوەر بوو بۆیە هێنایە دی ، یان بڵێن خوا پێویستی بە بوونەوەر نەبوو بەڵام هەروا لەخۆڕا و بێ حیکمەت و هۆ خوڵقاندی !!
دیارە هەردووکیشیان یەك لە یەکی خراپترن ، چونکە یەکەمیان ئاتاجی ی پاڵدەداتە لای خوا و ، دووەمیشیان نەزانی و بێ حیکمەتی و کاری بێ جێ کردن !!
ئێمەش لە وەڵام دا دەڵێین :
نەخێر ئێمە بۆ وەلامی پرسیاری ( خوا بوونەوەری بۆ خوڵقاندووە؟!) ناچارنین کە حەتمەن یەکێك لەو دوو ڕێیە خوارووخێچ و نالەبارەی سەرێ هەڵبژێرین ، بەڵکو ڕێی یەکی دیکەی سێیەمی لەبار و تەخت و ماقووڵ هەیەو ، تا ڕێی ڕاست و تەختیش هەبێ کا بەسەرا مەگەر خوا لێی گۆڕیبێ یان کەری دێزە بێ دەنا پێویست ناکات وەری ی عاسێ هەڵگەڕێ و ملی تەلانی لابەلا بگرێ !!
ئێمە دەڵێین : ئایا مەرجە ئەگەر هەرکەسیك کاریك بکات حەوجێی ی نەبێ و بۆخۆی سوودی لێ وەرنەگرێ حەتمەن بە کارێکی بێ جێ و ناحەکیمانە لەقەڵەم بدرێ ؟!
دیارە نەخێر چونکە ئەو کارانەی ئەنجام دەدرێن مەرج نیە هەموویان هەر پاڵنەری حەوجێ بێ و پێویستی پێ بوون و سەرتێ وەستان و پەك لەسەرکەوتن بیان هێنێتەدی ! ئایا تۆ لەکاتێك دا بەلای سواڵکەرێکی هەژار و بێ دەست دا ڕەت دەبێ و دەست دەبەیە باخەڵێ (دینار)ێکی دەدەیە بۆیە دەیدەیە چونکە سەرتێی وەستاوەو پێویستیت پێ یەتی ؟!

دیاره نەخێر، ئەدی چ شتێک پاڵت پێوەدەنێ یارمەتی بدەی ؟دیارە بەزەیی پێدا هاتنەوەو دڵ پێ سووتانت !!

دە بە هەمان پێ ودانیش/ خودا سبحانە وتعالی هیچ پێویستی یەکی بە ئێمە نیەو پەکی لەسەرمان نەکەوتوە، بەڵکو ئێمە هەموومان حەوجێ و جا ولەدەستی وین وەک فەرموویەتی :

( یا ایها الناس انتم الفقراء الی الله والله هو الغنی الحمید ) الفاطر / ١٥

واتە : ئەی خەڵکینە ! ئێوە حەوجێ ی خوان و خودا بۆخوی دەوڵەمەندی سوپاس بۆکراوە . بەڵێ خودا نە ئێمەو نە هیچ شتێکی لە بوونەوەردا بەخوڵقاندوە ، بو ئەوەی مەدا ریێکی خۆی پێ سازبکات و کەلێنێکی پێ پرەکات !!

ئەوە لە لایەکەوە ، لە لایەکی دیکەشەوە وەک روونمان کردەوەو سەلماندمان مەرج نیە ئەو ئیش و کارانەی ئەنجام دەدرین مادام بە پاڵنەری ئاتاجی و پەک لەسەرکەوتن نەیەنە دی بێ حیکمەت و نەزانانە بن ، بەڵکو جاری وایە نەک خودا جل جلاله تەنانەت مرۆڤیش هەندێک کاران دەکات هیچ پێویستی بەو کارانە نیەو ئەوپەری حیکمەت و لێزانیشیان تیدایە ، کە بریتی یە لە یاریدەدانی فەقیرو دەست گرتنی و بە هاناوە هاتنی بە پاڵنەری چاکەکاری و بەزەیی و بەخشندەیی !!

---

(١) بۆیە رووی قسەم لە باپای دوێنراو خاوەن پرسیارە ) چونکە ئەو بروای بە دوارۆژیش نیە تاکو بگوتری : بویە کابرای بەخشەر مالەکەی دەبەخشی و یاریدەی نەدارێکی پێ دەدات چونکە حەوجێ ی پاداشتی خودایە لە بەهەشتی دا ، بەڵکو ناچارین بڵێین هاندەرو پاڵنەری ئەو پارە بەخشینەی کابرای بێ بروا ، بەس بەزەیی پیدا هاتنەوەو دڵ پێ سووتانە .

نە سەرتێ وەستان و پێویستـــــی
کەوا تە خوداش، کە ئێمەو بوونەوەری خولقاندوە، نە سەرتێ وەستان و پێویستـــــی
پێ بوون و ،نە بێ حیکمەتی و هەوەنتە کاری ، شتاقیان لە گورێ دا نەبوون بەڵکو
بەس ئەوە لە گۆڕێ دا بووە کە خودا ( رحمن ورحیم ) ەو خاوەنی ئەوپەڕی میهرەبانیو
بەخشندەیی و چاکەکاری یەو، ئنجا، هەموو جۆرە بەزەیی نواندن و چاکەکاری یەکیشی
لەدەست دێ و ویستوویەتی چاکەمان لەگەڵ بکا و لەڕووی لوتف و بەزەیی یەوە لـــــە
سەرچاوەی ڕوونی بوون ( الوجود ) بەشمان بدات .

بوونەوەر شاری بێ ساهیبەو نەکەس دروستی کردووەو نەکەسیش هوشیوری دەخواو بەسەرزی

رادەگا (١) وە بە پێچەوانەی ئەو فەیلەسووفە کەللەوشك و دڵ مردوانەوە کە بەس وەك ...

وەگەرخەرو دروستکەرێك سەیری خودا دەکەن و زیاتر وەك وەستاو ئەندازیارێك لەخـوا وە

رادەمینن، هەتا خوایەکی بەخێوکەرو پەروەردگارێکی بەسۆزو بەخشندە .

آ- خـوا تاك و تەنیاو بێ وێنەو هاوتایە

++++++++++++++++++++++++++++++++++++++++

موۆقی مسوڵمان بڕوای وایە خوای میهرەبان تاك و تەنیایەو هەموو شتێك حەوجێی

وی یەو ئەو حەوجێی هیچ شتێك نیە، کەسی لێ نەبوەو لەکەسیش نەبوە بێ وێنەو هاوتایە (٢)

نە لە زاتی دا نە لە سیفەتەکانی دوەك. هیچ کام لە دروستکراوەکانی ناچێ، هەربوو و (٣)

(ازلی) و بێ سەرەتایە، هەرماو (ابدی) و بێ کۆتایە . (٤)

---

(١) ( وما خلقنا السماء والارض وما بينهما باطلا ذلك ظن الذين كفروا .. ) ص / ٢٧

وە ئاسمان و زەوی و ئەوەی نێوانیانمان بە بەلاش دروست نەکردوون، ئەوە گومانی ئەوانە

- یە کە کافرن ...

(٢) ( قل هو الله احد الله الصمد لم يلد ولم يولد ولم يكن له كفوا احد )

الاخلاص / بلێ : ئەو خوایەکی تاکە، خوایەکە هەموو شتێك حەوجێ بەتی و ئەو حەوجێ ی

کەس نیە . کەسی لێ نەبوە، لە کەسیش نەبوە وە هیچ کەس هاوتای وی نیە .

(٣) ( ليس كمثله شئ ) الشوری / ١١ هیچ شتێك وەك وی نیە .

(٤) ( هو الاول والاخر ) الحديد / ٣ ئەو یەکەمین و دوامینە، یانی نە لەپێش

وی هیچ هەبوە نە لەدوای وی هیچ دەبێ .

نەك وەكو ئەفسانەی ئیغریقی كە بۆ هەركام لە دیاردە سروشتی یەكانی وەك : بـــا،

باران، ئاگر، هەور، لافاو، بروسكە ... هتد خوایەكی تایبەتی بڕیار دەدات . وە نــەك

وەك ئەفسانەكانی كلێسای كلێس كە منداڵ و هاوسەر بۆخوا دادەنێ و عیساو دایكیشی

سەلامی خوایان لێ بێ بە دوو خوای دیكە لەقەڵەم دەدەن، وە نەك وەك جوولەكەكان كە منداڵ

بۆخوا بڕیار دەدەن و زیاتر وەك ئینسان سەیری دەكەن . وە نەك وەكو زەردەشتی یەكان كە

ڕووناكی بە خوای خێر ( یەزدان ) و تاریكی بە خوای خراپە ( ئەهریمەن ) دادەنێن .

٣- خوا خاوەنی هەموو سیفەتێكی بەرزو پەسندەو لە هەموو لەكەیەك دوورە
++++++++++++++++++++++++++++++++++++++++++++++++++++++++++++++++

مسوڵمان بڕوای وایە كە خوای دەستەڵاتدارو بەخشندە خاوەنی هەموو سیفەتێكی بەرزو

چاك و پەسندەو لە هەموو سیفەتێكی ناتەواوو خراپ بەری یەو هەتا بــــلێی (١)

---

(١) ( وله الحمد فی السموات والارض .. ) الروم / ١٨ . وە هەرچی لە ئاسمانەكان و

زەوی - بوونەوەر - دا هەیە سوپاس و ستایشی خودا دەكات .

تێبینی : هەڵبەتە خودا خاوەنی ئەوپەڕی سیفەت بەرزی و ئاكار پەسندی نەبایە لە تێكڕای

بوونەوەردا سوپاسی نەدەكرا ، چونكە بەبێ چاكی و پەسندی سوپاس بۆكران نایەتە دی .

(١)
پاك و بێ گەردە ، وە بڕوای وایە کە سیفەتە بەرزو پەسندەکانی خوا دیاری کراو نیین
(٢)
وە بێ سنوورن ، واتە خوا هەموو شتێك دەزانێ و (٣) توانای بەسەر هەموو شتێك دا دەشکێ و
(٥)
(٤)
هەرچی بیەوێ دەیکا و هیچ شتێك نیە نەیبینێ ونەیبیستێ ، وە خوای مەزن ژیانی
(٦)
لەخۆیەوەیەو ئەو ژیان بە غەیری خۆی دەبەخشێ . وە گۆیایەو قسەی وی بێ هاوتایە
(٧)
لە راستی و رەوانی و رێك و پێکی دا ، وە خوای بێ هاوەڵ ئەوپەڕی

(١) ( تسبح له السموات السبع والارض ومن فيهن وان من شئ الا يسبح بحمده ) الاسراء / ٤٤ / حەوت ئاسمانەکان و زەوی و هەرچی تێیان دا هەیە پاکی بۆوی بریاردەدات

وە هیچ شتێك نیە کە پاکی و پەسندی وی رانەگەیەنێ .

(٢) ( ان الله لايخفى عليه شئ فى الارض ولا فى السماء ) ال عمران / ٣ .
خوا هیچ شتێکی لێ ون نابێ نە لە زەوی و نە لە ئاسمانێ .

(٣) ( ان الله على كل شئ قدير ) البقره/٢٠ . بەراستی خوا لەسەر هەموو شتێك بەتوانایە .

(٤) ( فعّال لما يريد ) البروج / ١٦ . هەرچی بیەوێ دەیکا .
(٥) ( وهو السميع العليم ) الشورى / ١١ . وە ئەو بیسەرو بینایە .
(٦) ( الحى القيوم ) البقره/ ٢٥٥ . زیندوویەو سەرپەرشتیکەرە .
(٧) ( وتمت كلمه ربك صدقا وعدلا ) الانعام / ١١٥ . وە قسەی پەروەردگارت لەوپەڕی راستی و رێك و پێکی دایە .

خوێ بــۆ شتێك هیچ قەهریشی و توورەیی (١) بەخشندەیی هەیەو ، لێبوردن و بەزەیی

ڕانا گرێ (٢) وە دادگەری و (٣) کاربەجی یی (٤) خودا وێنەی نیە •

---

(١) ( وكان الله غفورا رحيما ) الاحزاب/ ٥٩ • وە خودا لێبوردەو بە بەزەیی یە •
( الرحمن الرحيم ) الفاتحه/٣ • بەبەزەیی بەخشندەیە •

(٢) ( هو الله الواحد القهار ) الزمر/٤ • ئەو خودا یەكی تاك و دەستەلاتدارە •
( ان الله عزيز ذو انتقام ) ابراهيم/ ٤٧ • بەڕاستی خودا دەستەلاتــدارو تۆڵە ئەستێنە •

(٣) ( اليس الله باحكم الحاكمين ) التين / ٨ • ئایا خودا دادگەرترین فەرمانڕەوا نیە ؟!

(٤) ( لا اله الا هو العزيز الحكيم ) ال عمران / ١٨ • بێجگە لەوی ج خوا نیە دەستەلاتدارو كاربەجێ یە •
( والله عليم حكيم ) النور / ١٨ • وە خوا زاناو كاربەجێ یە •

٤ـ خوا خاوەنی چەند ناوێکە کە چاکترین و تەواوترین ناون

++++++++++++++++++++++++++++++++++++++++++++++++++++++

مرۆڤی مسوڵمان بڕوای وایە کە خوای پەروەردگار خاوەنی چەند ناوێکە (١)، ئەو ناوانە بەرزترین و تەواوترین ناون و پێویستە مرۆڤ بەس بەو ناوانە بانـــگی خـــودا

(١) (ان لله تسعه وتسعين اسما من حفظها دخل الجنه) متفق عليه.

واتە: خودا نەوەدو نۆ ناوی هەیە هەرکەسێ لەبەریان بکات ـ وە ڕەفتاریان پـێ بکات ـ دەچێتە بەهەشتێ ـ وە ئەمش ناوەکانن:

١ـ الله خودا
٢ـ الرحمن بەبەزەیی
٣ـ الرحيم بەخشندە
٤ـ الملك سەرۆك، پاشا
٥ـ القدوس پاك
٦ـ السلام بێ عەیب
٧ـ المؤمن دڵنیاکەر
٨ـ المهيمن بەسەر راگەیشتوو
٩ـ العزيز زاڵ
١٠ـ الجبار بالادەست
١١ـ المتكبر خۆ بەگەورەزان
١٢ـ الخالق دروست کەر، بنیات نەر
١٣ـ البارئ بەدیهێنەر
١٤ـ المصور وێنەکێش
١٥ـ الغفار تاوان پۆش
١٦ـ القهار گەردن کەچکەر
١٧ـ الوهاب بەخشەر
١٨ـ الرزاق ڕۆزی دەر
١٩ـ الفتاح دەرووکەرەوە
٢٠ـ العليم زانا
٢١ـ القابض لێگرەوە، وێکهێنەر
٢٢ـ الباسط لەدوودەر، فراوانکەر
٢٣ـ الخافض نەوی کەر، دانەوێن
٢٤ـ الرافع بلندکەر
٢٥ـ المعز زاڵکەر
٢٦ـ المذل زەبوون کەر
٢٧ـ السميع بیسەر
٢٨ـ البصير بینەر

٢٩- الحكيم   فەرمانڕەوا، حوکمگێڕ

٣٠- العدل   دادگەر

٣١- اللطيف   نابەرهەست، وردبین
چاکەکاری پەنهان

٣٢- الخبير   شارەزا، هەواڵدەر
چی یەت زان

٣٣- الحليم   هێدی، ئارام

٣٤- العظيم   مەزن

٣٥- الغفور   گوناح پۆش

الشكور   ستایشکەر، سوپاسگوزار

٣٧- العلیّ   بەرز

٣٨- الكبير   گەورە

٣٩- الحفيظ   پارێزەر

٤٠- المقيت   بژیوگەیێن، دەستەلاتدار

٤١- الحسيب   لێپرسەرەوە

٤٢- الجليل   سیفەت بەرز

٤٣- الكريم   خاوەن ڕێز

٤٤- الرّقيب   چاودێر

٤٥- المجيب   وەلامگۆ

٤٦- الواسع   فراوان، بەبەرەوەبوو

٤٧- الحكيم   کاربەجێ، لێزان

٤٨- الودود   بەندەدۆست

٤٩- المجيد   پایەبەرز

٥٠- الباعث   زیندووکەرەوە، نێرەر

٥١- الشّهيد   ئاگادار، ئامادە، شایەد

٥٢- الحق   پایەدار، ڕاست، هەق

٥٣- الوكيل   پشت و پەنا، کارپێ سپێرراو

٥٤- القوی   بەتوانا

٥٥- المتين   بەهێز، قایم

٥٦- الولی   دۆست، یاریدەدەر

٥٧- الحميد   سوپاسکراو، شایستەی سوپاس

٥٨- المحصی   ژمێرەر

٥٩- المبدئ   بەپیداکەر

٦٠- المعيد   گێڕەرەوە

٦١- المحی   ژیێنەر

٦٢- المميت   مرێنەر

٦٣- الحی   زیندوو

٦٤- القيوم   مشووڕگێڕ، ڕاوەستاو

٦٥- الواجد   هەبوو

٦٦- الواحد   یەک

٦٧- الأحد   تاك، تەنیا

٦٨- الصمد   حەوجێ پێ بوو

٦٩- القادر   توانادار

٧٠- المقتدر   زۆر توانادار

٧١- المقدم   پێشخەر

٧٢- المؤخر   دواخەر

٧٣- الاول   یەکەمین

٧٤- الآخر   دوامین

٧٥- الظاهر   ئاشکرا، دیار

٧٦- الباطن   پەنهان، ون

٧٧- الوالی   سەرپەرشتی کەر

٧٨- المتعال   زۆر بەرز

٧٩- البر   چاکەکار

٨٠- التواب   تۆبەوەرگر

٨١- المنتقم   تۆڵەستێن

٨٢- العفو   لێبوردە

٨٣- الرؤوف   میهرەبان

٨٤- مالك الملك   خاوەن ملك

٨٥- ذو الجلال والاكرام   خاوەن پایەی بەرزو رێز

٨٦- المقسط   دادپەروەر

٨٧- الجامع   کۆکەرەوە

٨٨- الغنی   دەوڵەمەند

٨٩- المغنی   دەوڵەمەندکەر

٩٠- المانع   پێشگیری کەر، بەرگر

٩١- الضار   زیان گەیێن

٩٢- النافع   سوودگەیێن

٩٣- النور   رووناکی

٩٤- الهادی   رێ پیشاندەر

٩٥- البدیع   داهێنەر، بێ وێنە

٩٦- الباقی   هەرماو

٩٧- الوارث   میراتگر

٩٨- الرشید   کارزان، شارەزاکەر

٩٩- الصبور   ئارامگر

تێ بینی :

١- ئەم ناوانە لە فەرموودەیەك دا هاتوون كە ( ترمذی ) گێڕاویەتەوە .

٢- مەبەست لە ( من حفظها دخل الجنة ) ئەوەیە كە واتا كانیان بزانێ و بڕوایان پێ بێنی و ئەوانەش كە لەگەڵ مرۆڤ دا دەگونجێن وەك ڕەوشتێكی بەرزو پەسند لە خۆیاندا بێنیێتە دی .

٣- هەندێك لە ناوە پەسندو چاكەكانی خودا ( صیغة المبالغة ) یان بۆ بەكار هێنراوە وەك : الفتاح التواب الوهاب .. الخ بەڵام لەبەرئەوەی لە كوردی دا ئەم جۆرە دەربڕین ( تعبیر )ە نیە من هەروا بە ئاسایی وەرم گێڕاونە سەر كوردی .

دەنا لەڕاستی دا ئەگەر مانای وشەییم ڕەچاو كردبا دەبوو بۆ ( الفتاح ) گوتبام زۆر زۆر زۆر ...... دەرووكەرەوە !! وە هەروەها بۆ ئەوانی دیكەش ..

(١)

بکات و لەبەری وەپارێ و هیچ ناوێکی دیکەی لێ هەڵنەدات ، هەڵبەتە ئەو ناوانەش هەر

کامێکیان درووشم و نیشانەی یەکێک لە سیفەتە تەواو و بەرزەکانی خودان ٠

٥ ـ خودا هەمووشتێکی لەسەر بنچینەی زانیاری یەکی قووڵ و بێ سنوور خوڵقاندووە

++++++++++++++++++++++++++++++++++++++++++++++++++++++++++++++++++++++++++++++

مرۆڤی مسوڵمان بڕوای وایە کە خودا هەرچی دروستی کردوە هەمووی لەسەر بنچینەی زانیاری

ـ یەکی قووڵ و بێ سنوور دروست کردوەو لە هیچ کام لە دروستکراوانی خوادا هیچ تەنەی

شووکی دەرزی یەش نارێکی و بێ یاسایی نابینرێ ٠ (٢)

---

(١) ( ولله الاسماء الحسنى فادعوه بها وذروا الذين يلحدون فى اسمائه ) الاعراف/١٨٠

وە خودا ناوی چاك و پەسندی هەن بەو ناوانە بانگی بکەن وە واز لەوانە بێنن کە لە

ناوەکانی لادەدەن و دەیان گۆڕن ٠

(٢) ( ما ترى فى خلق الرحمن من تفاوت فارجع البصر هل ترى من فطور ثم ارجع البصر

كرتين ينقلب اليك البصر خاسئا وهو حسير ) الملك / ٣ ، ٤

لە دروستکراوی خوادا نالێکی نابینی چاوبگێڕە بزانە هیچ کەلێن و کونان دەبینی !

دووبارە جار لەدوای جار چاوبگێڕە بەلام لەئەنجامدا چاوت بە دەرکراوی و ماندوویی

دەگەڕێتەوە لات ٠

خوێنەری خۆشەویست ئەم دەقەی سەرێ ئەنجامگیری ( استنتاج ) یەکی یەکجار

گرنگ و بایەخدارى لێ وەدىدێ .

ئەوێش ئەوەیە کە بە پێچەوانەى ورینەو قسەى بزرکێنراوى کەسانێکەوە کە خۆ بە بێ بڕوا و دژخوا !! پیشان دەدەن، گەشە کردن و بەرەوپێش چوونى زانیارى و پەردە لاچوونى لەسەر ڕازو نهێنییەکانى بوونەوەر و دۆزرانەوەى یاساى دەستوورەکانى سروشت نەک تەنها نابێتە هۆى بەرەو پاش چوونەوەى بیرى ئایینى (الفکر الدینى) و نەرەوبێى بڕوایى چوونى خەڵک بەڵکو بە پێچەوانەوە هەتا پتر زانیارى بەرەو پێش بچێ و زیاتر ڕازو نهێنییەکانى بوونەوەر ئاشکرابن و، یاساو دەستوورەکانى سروشت چاکتر پەییان پێ ببرێ و بدۆزرێنەوە، بیرى ئایینى - بەلام ئایینى ڕاست و نەشێوێنراو کە بەس ئیسلامە - بەگشتى و بڕوا بەخوا بوون و خواناسى بەتایبەتى زیاتر گەشە ئەکاو فراژوو دەبێ و چاکتر ڕەگ دادەکوتێ لە دڵ و دەروون و بیرو هۆشى خەڵکی دا .

دەزانى بۆ ؟!

چونکە بۆتەوەر کتێبى بینراو (کتاب منظور)ى خودایەوە جێگەى تێدا بەرکەوتنى سیفەتە بەرزو مەسندەکانى یەتى لە ویست و توانا و زانیارى و بەزەیی و ...هتد. وە ئاوێتەى تێدا دژەوشانەوەى ناوەکانییەتى .

ئنجا گومانى تێدا نیە مرۆڤ هەتا پتر بە کتێبى نووسەرێکا ئاشنا بێ، زیاتر بەبەرى کەسایەتى ئەو نووسەرەو سنیفەتەکانى ئاشنا دەبێ و چاکترى دەناسێ .

بۆ وێنە ئێمە هەتا زیاتر کتێبى (احیاء علوم الدین)ى ئیمامى غەززالی و (رسائل النور)ى (نورسى) و (فى ظلال القرآن)ى سەیید قوطب و (تفهیم القرآن)ى مەودوودى

موتاڵا بکەین و بخوێنینەوەو بتوێژینەوە، پتر پەی بە پایە بەرزی و شارەزایی ئەو ... ناودارانە دەبەین و چاکتر دەیان ناسین، خوا لە هەموویان خۆش بێ و پلەیان بەرز بکاتەوە.

ئنجا لە ڕاستی دا ڕاست بە پێچەوانەی ورێنەی بێ بڕوایانەوە، هەتا زیاتر زانیاری گەشە بکات و بوونەوەر چاکتر یاسا و دەستوورەکانی ئاشکرا بن، بیری بێ بڕوایی و کافرایەتی زیاتر پاشەکشە دەکا و بەپاشەوە دەچێتەوە!!

دەزانی بۆ؟!

چونکە بیری بێ بڕوایی بە هەموو جۆرو شێوەکانی یەوە، سەرجەم دەچێتەوە سەر یەك ئەسڵ، ئەویش ئەوەیە کە بوونەوەرو هەرچی تێیدایە، لەخۆوەو بێ هیچ کردگارو .. پەروەردگارو مشوور خۆرێك دروست بووەو بەڕێوە دەچێ!!

بە واتایەکی دی هەموو جۆرو شێوەکانی بیری بێ بڕوایی سەرجەم لەو بنچینەیەدا ... هاوبەشن و لەسەر ئەو ئەسڵە ڕێك کەوتوون، کە دروست بوون و بەڕێوەچوونی بوونەوەر سەرچاوەیەکی عاقڵانەو حەکیمانەی نیە!!

بەکوردی بوونەوەر بە ڕێکەوت و هەرەمەکی و گۆترەکاری دروست بوەو، هیچ کەس نەخشەو بەرنامەیەکی زانیاری یانەی وردو قووڵی بۆ دانەناوەو، وەك ( تەلانی لابەسەلا ) کەوتوتە ڕێ و، کەسیش نازانێ بۆکوێ دەچێ و پاشەڕۆژو سەرەنجامی چۆن دەبێ!!

بەڵام بەرەو پێش چوونی زانیاری ( سەرلەبەری لقەکانی بەتایبەتی زانیاری یە سروشتی یەکان ) و دۆزرانەوەی یاسا و دەستوورەکانی و پەردە لاچوون لەسەر ڕازو

نهێنیيە سەرسامکەرەکانی و، پەی بردن بە ڕێك و پێکی و یاسادازی یەکەی بە ئاشکراو بێ چەندو چوون ڕای دەگەیەنێ :

کە بابە ئاگادار بن بوونەوەر ( تەلانی لابەلا ) و گورزی ( شەلم کوێوم کەس نا بوێرم ) نیەو لەسەر بنچینەی زانیاری و لێزانی یەکی وردو قووڵ و حسێب کراو ڕۆنراوەو ... بەگوێرەی نەخشەو بەرنامەیەکی زانایانە بەڕێوە دەچێ !!

کەواتە ئەو ئەسڵ و بنچینەیەی کە بێ بڕوایان کردبوویان بە بناغەی بیری ~~قربوکیلنو~~ قرپۆکیان و، کۆشکی ئەفسانەیی خوا نەناسی یان لەسەر هەڵچنی بوو، نە بەردو ... نە کەستەك و نە قوروو...بەڵکو تەپاڵەش تەواو دەرنەچوو !!

جا گومانیشی تێدا نیە : کە دیواری بێ بناغە ڕاناوەستێ و، دەستبەجێ بە لاچوونو نەمانی بناغە دیواریش لەسەرڕا بۆخواری هەرەس دێنێ و هیچی بەسەر هیچەوە نامێنێ !

هەر بۆیەش خوای بێ وێنە فەرموویەتی (سنریهم ایاتنا فی الافاق وفی انفسهم حتی یتبین لهم انه الحق ...) فصلت / ٥٣ . واتە : لەمەودوا بەڵگەو نیشانەکانی خومانیان پیشان دەدەین لە ئاسۆیەکان - ئاسمانەکان - داو لە نەفسی خۆیان دا هەتا بۆیان ڕوون بێتەوە کە ئەو - خودا - هەقەو ڕاستە .

بێگومان ئەم ئایەتە گفت و بەڵێن و مزگێنی یەکی خۆشی تێدایە، کە ئێستا سوپاس بوخوا بەچاوی خۆمان دەیبینین . چۆن زانیاری یە سروشتی یەکان بوونە خزمەتکارو بەردەستێکی بێ فیزی بیری ئایینی و، چاکترین و بەهێزترین پاڵپشتی بیری خواناسیو درەوشاوەترین و بێ پێچ و پەناترین بەڵگەی دەستی بڕواداران .

٦ـ خوا بەرنامەو پەیڕەوێکی ناردوە تاقە بەرنامەی ڕاست و تێرو تەواوە

***************************************************

مرۆڤی مسوڵمان بڕوای وایە کە خوای بێ وێنە هەروەك چۆن نە لە زاتی دا، نە لە سیفەتەکانی دا، نە لە دروست کراوانی دا، نە لە قسەو وتارەکانی دا، کەمو کووڕی و ناتەواوی و هەڵەو پەڵەی نیەو لە هەموو لایەنێکەوە پاك و بەرزو پەسندەو هاوتای نیە ئەوش بەرنامەو پەیڕەوش کە تەواوکەری بەرنامەی گشت پێغەمبەرانەو علیهم السلام بە (١) دوایین پێغەمبەری خوای ( محمد ) دا صلى الله عليه وسلم ناردوویەتی تێروتەواوو (٢) پاك و بێگەردەو وەڵامگۆی هەموو پرسیارەکانی ژیانی مرۆڤەو شیفاو چارەسەری (٣)

---

(١) ( وانزلنا اليك الكتاب بالحق مصدقا لما بين يديه من الكتاب ومهيمنا عليه ... ) المائدة/ ٤٨ . وە قورئانمان بۆ لای تۆ ناردوە ڕاستی تێدایە کتێبەکانی پێشی خوای بەڕاست دەزانێ و بە سەریانەوە شاهیدو چاودێرە .

(٢) ( ما كان محمد ابا احد من رجالكم ولكن رسول الله وخاتم النبيين ) الاحزاب/ ٤٠

(٣) ( اليوم اكملت لكم دينكم .. ) المائدة/ ٣ . ئەمڕۆ بەرنامەکەتانم بۆ تەواو کردن .

(٤) ( ونزلنا عليك الكتاب تبيانا لكل شئ وهدى ورحمة وبشرى للمسلمين ) النحل/ ٨٩ وە قورئانمان ناردۆتە سەر تۆ هەموو شتێك ڕوون دەکاتەوە وە ڕێ ڕوونی و خێرو خۆشی و مژدەیە بۆ مسوڵمانان .

(١)
سەرلەبەری ئیرو گرفت و دەردو نەخۆشی یەکانیەتی و تاقە بەرنامەیەکە، کە بتوانێ سەر
(٢)
- بەرزی و بەختیاری ڕاستەقینە بۆ تاك و کومەڵ بێنێتە دی و دادگەری و یەکسانسی و
(٣)
ئازادی لەنێو کومەڵ دا بچەسپێنێ، وە تاقە بەرنامەو ڕێبازێکە کە ئینسان بتوانێ
(٤)
بەهەشتی بەرین و ڕەزامەندی خودای پێ وەدەست بێنێ .

---

(١) ( قل هو للذین امنوا هدی وشفاء .. ) فصلت / ٤٤ . بڵێ ئەوە ڕێنمایی و دەرمان و چارەسەرە بو ئەوانەی بڕوادارن . ( وننزل من القران ما هو شفاء ورحمة للمومنین ) الاسراء / ٨٢ . وە ئەوەی لە قورئانێ دەینێرینە خوارێ چارەسەرو ڕەحمیەتە بۆ بڕواداران .

(٢) (ولله العزه ولرسوله وللمومنین..) المنافقون / ٨ . وە سەربەرزی بۆ خواو بۆ پێغەمبەرەکەی و بۆ بڕوادارانە . ( من عمل صالحا من ذکر او انثی وهو مومن فلنحیینه حیاة طیبة ) النحل / ٩٧ . هەرکەسێك کردەوەی چاك بکات لە نێر یان لە مێ وە بڕوادار یش بێ ئەوە لە ژیانێکی خۆش و پڕ ئارامی دا دەیژیەنین .

(٣) ( ان الله یامر بالعدل والاحسان وایتاء ذی القربی ..) النحل / ٩٠ . خودا فەرمان دەکات بە دادگەری و چاکەکردن و دەستگیرۆی کردنی خزمان . ( فلذلك فادع واستقم کما امرت ولا تتبع اهوائهم وقل امنت بما انزل الله من کتاب وامرت لاعدل بینکم ) الشوری / ١٥ جا بانگەوازی بکە بۆ ئەوەی کە پێوترا، وە وەکو فەرمانت پێکراوە خۆت ڕاگرە وە مەکەوە دوای ئارەزووەکانیان وە بڵێ بڕوام بە هەر کتێبێك هێناوە کە خوا ناردوویەتی وە فەرمانم پێکراوە کە بە دادگەری حوکمتان لە نێوان دا بکەم .

(٤) (ان هذا القران یهدی للتی هی اقوم ویبشر المومنین الذین یعملون الصالحات ان لهم اجرا کبیرا ) الاسراء / ٩ . بەراستی ئەم قورئانە ڕێنمایی مرۆڤ دەکات بۆ تەواوترین ژیان وە موژدەی پاداشتێکی گەورە دەدات بەو بڕوادارانەی کە کردەوەی چاك دەکەن .

٧- خوا هەموو کردەوەکانی ڕاست و بەجێ و حیکمەت دارن

*****************************************************

مرۆڤی مسوڵمان بڕوای وایە کە هەرچی خودا بیکات و ئەنجامی بدات بێ سوودو حیکمەت نیەو مەرجیش نیە مرۆڤ پەی بە ڕازو نهێنی و حیکمەتی هەموو کردا ریێکی خوا بەرێ، کەواتە : خوای بەخشندەو تۆڵەسێنی هەروەک چۆن زاتی و سیفەتی و قسەی و بەرنامەی و دروست کراوی و ناوی، لەوپەڕی تێرو تەواوی دان و لە هەموو کەمو کوڕی یەك بەدوورن، کردا ریشی دیسان بەپێی حیکمەت و زانیاری یەکی بێ وێنەیەو .... هەموو کردەوەیەکی بەجێ یەو پڕ لە سوودو خێرو بەرژەوەندی یە (١) .

---

(١) ( وعسى ان تكرهوا شيئا وهو خير لكم وعسى ان تحبوا شيئا وهو شر لكم ) البقرە/ ٢١٦ . وە ڕەنگە شتێکتان بدزێ و ئەو شتە بۆتان چاك بێ وە .... ڕەنگە شتێکتان خۆش بوێ و ئەو شتە بۆتان خراپ بێت .

جا لێرەدا دەمەوێ وەڵامێکی ورد بخەمەڕوو بۆ پرسیارێك کە ڕەنگە خوتخوتەی زۆر دڵان بدات، باشە مادام کردەوەکانی خودا هەموویان لەسەر بنچینەی زانیاری و لێزانی یەکی بێ سنوورو حیکمەتێکی بالا بەڕێوە دەچن، وە لە ڕاستیشدا هەرچی لەسە بوونەوەردا ڕوو دەدات لەولایەنەوە کە بە پێی زانیاری و نەخشەو ئەندازەگیری خودا و

بەهۆی ویست و دەسەڵاتی ویەوە پەیدا دەبێ دروستکراوی ویە، بۆچی نارەزایی بەرانبەر بە هەڵوێست و ڕەفتاری ستەمکارانەی زۆرداروطاغووتە، خۆ بەخوا زانەکان دەربڕین و لێیان ڕاپەڕین و ئەو بارودۆخ و واقیعە نائیسلامی یانەی هێناویانەدی بیان گۆڕین ؟!

...... مادام ئەو ڕووداو کارەساتانە بە ویست و دەسەڵاتی خواو بەگوێرەی نەخشەو بەرنامەی خوا دێنەدی و هەر کاروکردارێکیش خوا پەسەندیی هەستی و ئەنجامی بدات ڕاست و بەجێ و حیکمەتدار بێ، چۆن بەخۆمان ڕەوا ببینین دژی واقیعێك بجەنگین کە ویست و دەسەڵاتی خوای کاربەجێ و لێزان هێناویەتە دی ؟!

لەوەڵامدا دەڵێین : هەرچەندە جێی تەرخانی ئەم جۆرە باسانە ئاڵقەی (٤) ی ئەم زنجیرەیە بەناوی (قەزاو قەدەر) بەڵام لێرەش کورتە وەڵامێکی هەر دەدەینەوە .

ڕاستە ئەم واقیعەو هەر واقیع و کاروکارەسات و ڕووداوێکی چاك یان خراپ هەن بە ویستی خوداو بەگوێرەی نەخشەو بەرنامەیەك کە خودا داینا وە دێنە دی، بەڵام هەر ئەو خودایەی کە ئەو یاسا سروشتی یانە (القوانین التکوینیە) ی داناون کە بەپێ ی وان هەموو شتێك - چاك و خراپ - دێتە دی، هەمان خوداش چەند یاسایەکی شەرعی (القوانین التشریعیە) ی داناون کە فەرمانمان پێ دەکەن ڕاپەڕین و هەر واقیعێك و هەر دیاردەیەك لەگەڵ بەرنامەو شەرعی خوادا نەگونجا لای بەرین .

ئنجا دەبێ بزانین کە ویست و ڕەزامەندی (الارادە والرضی) ی خودا مەرج نیە هەموو دەمێ پێکەوە گونجاوو پەیوەست بن، بەڵکو جاری وایە لێك دەترازێن و دژی یەکدی دەوەستن، بۆ وێنە خودا لە قورئانێ دا دەفەرموێ (مەی مەخۆنەوە) بەڵام ویستی وایە کە شەڕابخورەکان بیخۆنەوە لێرەدا ویست و ڕەزامەندی خوا لێك جوێن .

کەواتە : مەرج نیە هەر واقیعێك بە ویستی خوا دروست بوو بەپێی ڕەزامەندی ..
خوداش بێ، بەڵکو دەبێ بۆ ئەوەی دا خوا فلان واقیع یان فلان کردەوە خوا پێی ڕازی یە
یان نا ، لە بەرنامەکەی دا بۆی بگەڕێین چونکە بەرنامەو ئاینی خوا هەموو دەمێ
لەگەڵ ڕەزامەندی ی دا پێکەوە جووتن و لێك نابترازێن .
کەواتە پوختەی قسان :
لەبەر ئەوەی خودا بەدیهێنەرو پەروەردگاری هەموو شتێکە ، ناگونجێ هیچ شتێك
بەبێ ویست و توانای وی دروست بێ ، کەواتە هەرچی پەیدا دەبێ چاك و خراپ هەر
بەپێی ویستی خودا و بەهۆی توانای وی یەوەیە ، بەلام مەرج نیە هەرچی بەپێی ویستی
خودا - ویستی خوداش لەو یاساو دەستوورانەدا بەڕێوە دەچێ کە لە بوونەوەرو ...
ژیانی ئینسان دا لەکاردان - پەیدا بوو خودا لێی ڕازی بێ تاکو ئێمەش ناچار ببین
ملی بۆ کەچ بکەین و پێی ڕازی بین .
ئنجا ئەوەی خودا لەسەر ئێمەی پێویست کردوە ئەوەیە کە بەپێی ئەو یاساو
دەستوورە ئاینی و شەرعی یانە بەڕێوە بچین ، کە خودا ناردوونی و لەگەڵ ڕەزامەند
- ی و پەسندی خۆی دا لێکی بەستوون ( ورضیت لكم الاسلام دینا ) المائدە/ ٣ .
چونکە ئێمە دەبێ بەدوای ڕەزامەندی خوا دا وێڵ و عەودال بین ڕەزامەندی خوداش لە
شوێن کەوتنی ئەو بەرنامەیەدایە کە لێی ڕازی یەو پەسندی کردوە .
دەنا ئەگەر بمانەوێ وەدوای ویستی خوا بکەوین ئەوە پێویست بە ویستن و نەویس
- تنی ئێمە ناکا چونکە هەرچی بکەین هەر بە ویستی خودا دەیکەین و ناتوانین
لەژێر ڕکێفی ویست و دەستەلاتی وی دەربچین ( وما تشاون الا ان یشاء الله ..)
التکویر/٢٩ . بەلام دەتوانین لە بەرنامەو ڕەزامەندی خودا دەرچین و لاری بین .

کەواتە :

ئێمە بۆیە رادەپەڕین بۆ گۆڕین و لابردنی ئەو واقیعانەی دژی بەرنامەی خودان چونکە خودا فەرمانی پێ کردووین و بەوە لێمان رازی دەبێ، ئنجا خوداش هەرچەندە ئەو واقیعانەی بە ویستی خۆی هێناونەدی، بەلام لەرێ ی کردەوەو ویست و هەلبژاردنێ خراپ و لەگەل شەرع و رەزامەندی خوادا نەگونجاوی خراپەکارانەوە هاتوونەدی، وە دەیەوێ بۆی بگۆڕین بە جۆرە واقیعێك کە لەگەل ئایین و رەزامەندی ی دا بگونجێن .

بە پێویستی دەزانم بۆ پتر روون بوونەوەی مەبەست پێشەکی وێنەیەك بێنینەوە - لەژیانی رۆژانەمان دا - بۆ چۆنیەتی لێك جوێ بوونی ( ویست و رەزامەندی ) و دوایش وێنەیەك دێنینەوە بۆ پتر ئاشکرا بوونی چەمکو مەبەستی ویستی خودا ( ارادة اللة ) :

وێنەی یەکەم بۆ روونکردنەوەی لێك جیایی ویست و رەزامەندی :

باپێك دوو کوڕی هەن پێیان دەلێ : روڵەکانم ئەوە بالغ بوون و لەمڕۆ بەدواوە پیاون و تەکلیفی شەرعتان لەسەرە، جا داواتان لێ دەکەم مسولمانێ چاك بن و بێ فەرمانی خواو پێغەمبەر صلی اللة علیە وسلم مەکەن، هەرکامێکتان پیاوی چاك بێ و بێ فەرمانی خوا نەکات با لە مالی من دا بمێنێتەوەو لەسەر چاومی دادەنێم ، بەلام هەرکامێکتان بێ فەرمانی و سەرەخەری بکات و رێ ی خوارو خێچ و هەلیەت و هەلدێر بگرێ، لە کوڕی خۆمی دەشۆرێنم و لەمالی خۆم وەدەرێ دەنێم ئەوە پێم گوتن پاشان نەلێن ئاگادار نەبووین و نەمانزانی !!

پاشان دوای ماوەیەك یەکیان ڕێی چاکەو خواپەرستی گرت و یەکیشیان سواری کەرێ شەیتانی بوو و نەهاتە ژێر بار، جا هەرچەندە بابەکە چەند جارێکی دیکەش ئامۆژگاری کردو ئاگاداری کردەوەو ترساندی، بەڵام فایدەی نەبوو! تا لە ئاکامدا بابەکە کوڕە بەدفەڕەکەی لە ماڵێ وەدەرنا و خوێڕی کردو بڕو بەخێرهاتی!!

جا با سەرنج بدەین!

بێگومان هەم مانەوەی کوڕە گوێ ڕایەڵو مسوڵمانەکەو هەم دەرکران و خوێڕی کرانی کوڕە بەدفەڕو لاسارەکەش هەردووکیان بە ویستی بابەکە هاتنەدی، بەڵام دیارە کە بابە - کە هەرچەندە لە مانەوەی کوڕە چاکەکەدا ڕەزامەندی هەبوو بەڵام لە دەرکرانی کوڕە بەدکارەکەدا ڕەزامەندی نەبوو، واتە مانەوەی کوڕە چاکەکەی پێ خۆش بوو بەڵام خوێڕی کرانی کوڕە بەدەکەی پێ خۆش نەبوو کەواتە: ڕاستە جاری وایە ئینسان شتێك دەکات و ویستی لەسەر پەیدا بوونی شتێکە بەڵام پێی خۆش نیەو لێی ڕازی نیە.

ئێستاش پێم وایە تا ئەندازەیەکی چاك چۆنیەتی لێك جوێ بوونی ویست و ڕەزامەندی خودا ڕوون بووە. ئنجا بچینە سەر وێنەی دووەم:

__وێنەی دووەم__ بۆ ڕوونکردنەوەی چەمك و واتای ویستی خودا:

دەتوانین ویست (ئارادە)ی خودا سبحانە وتعالی وە ئاوی کانی یەك بچوێنین کە ئاوێکی سپی و ساف و بێ ڕەنگ و بێ تام و بۆنە، دوو کەس دەچنە سەر ئەو کانی یەو یەکێکیان هەندێك ئاوی لێ هەڵدێنجێ و دەیکاتە نێو سوراحی یەکەوە(

ئەندا زەیەك شەكرو شەربەت و لیمۆندزی لەگەڵ تێكەڵ دەكات و شەربەتێكی شیرین و ...
بەتام و چێژی لێ دروست دەكات، ئەوی دیكەشیان هەر لە هەمان كانی هەندێك ئاو
هەڵدێنجی و لە گۆزەیەكی دەكاو پاشان مستێك خۆڵی تێ دەكات و ئاوی نێو گۆزەكە
دەكاتە ئاوێكی قوڕاوو پیس و نابەرچاو .

بێگومان: هەم شەربەتە شیرین و جوان و بۆن خوشەكەو هەم ئاوە قوڕاوو لیڵو
تام و بۆن ناخۆشەكەش ، هەردووكیان لە ئاوی كانی یە سپی و ساف و ڕوونەكە
هەڵهێنجرا بوون ، بەڵام ئی یەكەمیان بەهۆی دەستكاری و بەكارهێنانی چاكەوە ..
شەربەتی لە ئاوی كانی یەكە ڕەخساندو ئی دووەمیشیان بەهۆی دەست تێ وەردان و
خراپ بەكارهێنانەوە قوڕاوی لێ فەراهەم هێنا ، كەواتە ئاوی كانی یەكە لە ئەسڵ دا
سپی و ساف و بێ ڕەنگ و بێ تام و بۆن بوو ، بەڵام بە ویست و هەڵبژاردن و كردەوەی دوو
كەسەكە بەشێكی شەربەتی لێ دروست بوو و تام و بۆن و ڕەنگێكی چاكی گرتەوە ....
بەشێكیشی قوڕاوی لێ دروست بوو و تام و بۆن و ڕەنگێكی بەدو خراپی پێوەنووسا .

دەجا ئیرادەی خوداش بەهەمان شێوە :

خودا ویستی خۆی كردوتە یاریدەدەری هەموو كەس، ئنجا ئایا ئەو كەسانە بە
ویست و هەڵبژاردنی خۆیان تام و بۆن و ڕەنگی چاك لەگەڵ ویستی خوا لێك دەدەن و..
كارو ڕەفتارو واقیعی چاك و مسوڵمانانە دەڕەخسێنن، یان بە پێچەوانەوە تام و بۆن و
ڕەنگی بەدی لەگەڵ لێك دەدەن و كردارو ئاكارو بارودۆخی خراپ و نامسوڵمانانە پەیدا
دەكەن ئەوە عایدی خۆیانەو دەكەوێتەوە ئەستوی خۆیان .

ئنجا لەبەر ئەوەی خودا كوفرو خراپەی بەدڵ نیەو لێی ڕازی نیە لەسۆنگەی ئەوەوە
كە بە ویست و هەڵبژاردنی تاوانباران و تام و ڕەنگ و بۆنی خراپ و بەدی تاوانان ...
هاتۆتەدی وەك فەرموویەتی :( ..ان اللە لایرضی لعبادە الكفر..) الزمر/ ٧ .

واته ؛ بێگومان خوا کوفری پێ پەسند نیە - و پێ ی ڕازی نیە - بۆ بەندەکانی ٠

لەسۆنگەی ئەوەوە ، خوا فەرمانمان پێ دەکات کە ئەو واقیع و بارودۆخ و ئاکارو کردارە دزێوو خراپانە بگۆڕین و هەوڵ دەین بە ویست و هەڵبژاردنێکی لەگەڵ بەرنامەو ڕەزامەندی خودا دا گونجاو واقیع و بارودۆخ و ئاکارو ڕەفتارێك بێنینە ٠٠٠ کایەوە کە خودا پیی ڕازی بێ و تامو بۆن و ڕەنگیان لە ئاوی ساف و بێگەردی کانیاوی ویستی خودادا بێنینەدی ، کە لەگەڵ بەرنامەو یاسا شەرعی یە پەسندەکانی خوادا ٠٠ بگونجێن ، بۆ ئەوەی هەم ویست و ڕەزامەندی خوداو هەم ویستی ئێمەو ڕەزامەندی خودا پێکەوە گونجاو بن و دژو پێچەوانەی یەکدی نەبن ، وەك خـــــودا فەرموویەتی ؛ ( ٠٠وان تشکروا یرضه لکم ٠٠ ) الزمر / ٧ ٠ واتە ؛

وە ئەگەر سوپاسی خوا بکەن - و بەندەی چاك و بەئەمەگ بن - خوا بۆتان پەسند دەکاو لێتان ڕازی دەبێ ، هەڵبەتە ڕەزامەندی خوداش گەورەترین مەبەستی مرۆڤــــی خواناس و بەرزترین لوتکەی ئاوات و ئامانجیەتی وەك خودا فەرموویەتی ؛

( ٠٠ورضوان من الله اکبر ذلك هو الفوز العظیم ) التوبە / ٧٢ ٠

واتە ؛ وە ڕەزامەندی یەك لەلایەن خواوە گەورەترە - لە هەموو شتێك - هەر ئەوش بردنەوەی گەورەیە ٠

٨- خوا نەدانبەگەورەو بچووک کەس بە یەک چاو سەیر دەکاو پلەو ئیمتیازی نەداوەتە کەس

***************************************************************************

مرۆڤی مسولمان بڕوای وایە کە خودا بە یەک چاو سەیری مرۆڤەکان دەکاو هیچ پلەو پایەو ئیمتیازێکی نەداوەتە هیچ ئینسان (١) و هیچ نەتەوەو رەگەزو چین و توێژو خێڵ و تیرەو بنەماڵەیەک بەسەر باقی خەڵکی دا (٢) وەک جوولەکەکان دەیانگوت و دەیڵێن و باقی رەگەزو نەتەوەو تیرەو وەجاخ و چین پەرستەکان دەیڵێن. تاقە سەنگی مەحەک و پێوەرو تەرازووی خەڵک پێوان و هەڵسەنگاندنیش لەلای خوا بریتیە لە مسولمانەتی و تەقواو پارێزەوە (٣) هیچ کام لە پارەو سامان و دەسەڵات و رەنگ و زمان و رەگەزو وەجاخ ناگونجێ بکرێنە پێوەرو تەرازووی گەورەو بچووکی و گرانی و سووکی مرۆڤەکان.

---

(١) (یا ایها الناس) الحج/١ . (یا بنی ادم) یس/٦٠ . (یا ایها الانسان) الانفطار/٦ . ئەی خەڵکینە!... ئەی وەچەی ئادەم!... ئەی ئینسان!

(٢) (یا ایها الناس انا خلقناکم من ذکر وانثی..) الحجرات/ ١٣ . ئەی خەڵکینە ئێوەمان لە نێر (ئادەم) و مێ (حەووا) یەک دروست کردووە.

(٣) (ان اکرمکم عند الله اتقاکم) الحجرات/ ١٣ . بەراستی بەڕێزترتان لەلای خوا - واتە لە تەرازووی بەرنامەکەیدا - پارێزکارترتانە . (ان الله تعالی اذهب عنکم عُبیة الجاهلیه وفخریتها بالاباء انما هو مومن تقی وفاجر شقی الناس بنوا ادم وادم خلق من تراب) رواه ابو داوود والترمذی . واتە خوای بەرز فیزو دەماری نەفامی و خۆهەڵدانەوە بە باب و باپیرانی لە ئێوەدا لابردوە، بەس دووکەس هەن بڕوادارێکی پارێزکار، بەدکارێکی تاوانبار، خەڵک وەچەی ئادەمن و ئادەمیش لە گڵ دروستبوە.

(الناس مستوون کاسنان المشط لیس لاحد فضل علی احد الا بتقوی الله) اخرجه الدیلمی عن انس . واتە خەڵک وەک دەندانەکانی شانە یەکسانن کەس لە کەس گەورەتر نیە مەگەر بە زیاتر پارێزکردن لە خوا.

٩- خوا ڕێزی لە مرۆڤ گرتوەو خۆشی دەوێ و بە جێنشینی خوی پەسندی کردوە

******************************************************

مرۆڤی مسولمان بڕوای وایە کە خودا جل جلالە ئینسانی کردووە بە جێگری خۆی لەسەر زەوی و ڕیزی لێ گرتوەو خۆشی دەوێ[1]،[2] نەك وەك جوو و دیانەکان دەڵێن کە پێیان وایە خوا دانووی لەگەڵ ئینسان دا ناکولێ و ڕقی لێ یەتی و دوژمنایەتی کۆنیشیان پێکەوە هەیەو، هەر مرۆڤێك کە لە دایك دەبێ بە تاوانباری و شەرمەزاری لە دایك دەبێو ئەو تاوانەی کە کاتی خۆی (ئادەم) کردی بەلایەکە لە ئەستۆی هەموو مرۆڤێك دایەو[3] لەسێدارەدرانی عیساش علیه السلام بۆ سڕینەوەی ئەو تاوانە بووە![4]

---

(١) ( هو الذی جعلکم خلائف فی الارض) فاطر/٣٩ . ئەوخوایەی لەسەرزەویگێڕاونی بە جێ نشینن .

(٢) ( ولقد کرمنا بنی آدم ) الاسراء/٧٠ . وە ڕێزمان لە وەچەی ئادەم گرتوە . ( وهو الغفور الودود) البروج/١٤ . وە ئەو لێبوردەیەو بەندەکانی خۆی خۆش دەوێ .

(٣) هەرکەسێك سەرنجێکی سەرپێی لە تەورات و ئینجیل بدات شایەدی ڕاستی ی ئەم قسانە دەبینێ . ( بێگومان تەورات و ئینجیلی دەست کاری کراوو گۆڕدراو ) .

(٤) دیانەکان بڕوایان وایە کە عیسا علیه السلام کاتی خۆی بە دەستی جوولەکەکان گیراوەو لە قەنارە دراوە، هەڵبەتە قورئان ئەم قسەیەی وەدرۆ خستۆتەوەو فەرموویەتی ( وما قتلوه وما صلبوه ولکن شبه لهم ) النساء/ ١٥٧ . واتە: وە جووەکان عیسایان نەکوشتووەو لەداریان نەداوە، بەڵکو وێنەی ویان لێ براوەتە سەر یەکێکی دیکە . جا دیانەکان دەڵێن خوا بۆیە کوڕی خۆی بە لەدار دان دا تا ببێتە قوچی قوربانی بۆ مرۆڤایەتی و ئەو تاوانەی ئادەم کردی بیسڕێتەوە .

